کۆماری عیراق

وەزارەتی رۆشنبیریو راگەیاندن
دەزگای رۆشنبیریو بلاوکردنەوەی کوردی
زنجیرەی ژمارە ٧٤

# داربەڕوو

شیعری

مدحت بێخەو

# گزنگ (١) ١٠

لە سەنگەری سەهۆڵەکان
لە گشت دنیا ..
لە کەوانی جیاجیا
لە کاردان تیری ڤینەکان
دژی گزنگ پەیتا پەیتا
بەڵام کە نزیک ئەبنەوە
یەک لە دوای یەک ئەتوێنەوە
کەچی گزنگ بزەی لێوی
هەر زۆر ئەبێ
هەتا هەتا .. !

سێی ئاداری ١٩٧٨

---

(١) لە گۆڤاری بەیان ژمارە ٤٩ ی ١٩٧٨ بڵاو کراوەتەوە ..

# هێرۆ ..![1]

کاتێ خەزان ..
هێرۆیەکان هەڵوەران
وای زانی تووناو بوون نەمان
بەڵام هێرۆی بەرزو ڕەسەن
دوای وەیشوومەو تۆف و زریان
لەسەر ڕەگی خۆی ژیایەوە
لەسەر هەر بنجێ بەدەیان . !

٤/ ئاداری ١٩٧٨

---

(١) لە گۆڤاری بەیان ژمارە (٤٩) ی ١٩٧٨ بڵاو کرایەوە .

# گرەو ..

بۆ ئاهەنگی خۆشی بەهار
کۆ بوونەوە لە هەموو ڕەنگ
لە گوڵی باخ و لالەزار

هەریەکە خۆی لا جوان بوو
بوو بە کێشەو دەنگ و هاوار
بەڵام کاتێ بووکی نەورۆز
بیری لە گوڵان کردەوە
کامەیان جوانە بۆ قژی
گوڵاڵە گرەوی بردەوە !

١ ی ئاداری ١٩٧٨

---

(١) لە گۆڤاری بەیان ژمارە ٤٩ ی ١٩٧٨ بڵاو کراوەتەوە .

# گەڵا..!

لە وەرزی گەڵا ڕێزانا
گەڵایەکان تەگبیر دەکەن
هەندێ هەواڵ
بۆ دوور دەبەن
هەندێ دەبن بە خاک و تین
بۆ ڕەگەکان
تاکو دایکیان زویر نەبێ
تا پێیان نەڵێن نارەسەن.!

٦ی تەمووزی ١٩٧٩

---

(١) لە گۆڤاری بەیان ژمارە ٧٠ی ١٩٨١
بڵاو کراوەتەوە

# دەریا ..

دڵی فراوانی دەریا
گشت ئاوازی خوڕەو هاژەی
روبارانی دۆڵ و چیا
لەگەڵ خۆڵ و لم و ماسی
تێکەڵ ئەکاو یەکیان ئەخا
دژی ئەوەی کانیاوەکەی
بەر بەرد دەدا ..!

٢٥ی تەمووزی ١٩٧٩

---

(١) لە گۆڤاری بەیان ژمارە ٧٠ی ١٩٨١ بڵاو کراوەتەوە .

# تابلۆ . .

تابلۆیەکان کۆ بوونەوە
شاعیرێک بوو بە هەڵبژێر
بۆسەرچاوەی سرووشی گەڕا
گەڕا گەڕا . .
لەدوای گەلێ وردبوونەوە
دیمەنی لە پێکی زبرو
دوو چاوی قووڵ
یەکەم خەڵاتی بردەوە . !

١٩٧٩/٧/٢٨

---

(١) لە گۆڤاری بەیان ژمارە ٧٠ی ١٩٨١

# هەور !

هەوری کۆچەری بێ پەساپۆرت
سنوورەکان دەبەزێنێ
هەڵاوی ناخی زەویەکان هەڵدەمژێ
جیهان پێیکتر دەناسێنێ
مژدە بە کڵۆڵەکان ئەداو
مرواری زوڵاڵی یەکبوون دەبارێنێ
ناو ناوەش دژی تاریکی
بۆناو دڵی مەرگەوەران
قامچی ئاگر دەوەشێنێ .. !

١٥ی تەمووزی ١٩٧٩

---

(١). لەگۆڤاری بەیان ژمارە ٦٧٠ی ١٩٨١ بڵاو کراوەتەوە .

# وانەی نامەیێک ! (١)

(٢)
نامەی کێوی « قەرەچوخ » مان
جەفەنگی بوو کەس نەیزانی
لەدوای هەزار کارەساتی
جەرگ و دڵ بر
لە لێواری ئەشکەوتێکا
شوێنەوارێکی باپیران دۆزرایەوە
وەک چاوی گڕ
بۆ کلیلی نامەکە لێی هەڵکەنرابوو
وێنەی بیور - !!

١٠ی نیسانی ١٩٧٩

---

(١) لە گۆڤاری نووسەری کورد ژمارە (٢) ی خولی دووەمی ساڵی ١٩٧٩ بڵاوکراوەتەوە .

(٢) قەرەچوخ : ناوی کێوێکە لە نزیک شاری مەخمور لە پارێزگەی هەولێر .

# خلیسک !(١)

له ڕێیه ندانا شه‌خته‌ی ڕێ
ورد نه‌بین لێی هه‌ڵ ئه‌خلیسکێ
به‌ره‌و نشێو ڕیسوا ئه‌بێ
به‌ڵام ڕێزان ..
به هه نگاوو بیری چه سپاو
شه خته‌و هه‌ورازه‌کان ده‌بڕێ .!

١٢ی نیسانی ١٩٧٩

---

(١) له گۆڤاری نووسه‌ری کورد ژماره (٢)ی خولی دووه‌م ١٩٧٩ بڵاو کرابێوه .

# ئاسۆ ! (١)

ئاسۆیەکان ..
هێندە ئەویندارو شەیدان
هەموو ساتێك بۆ یەکتر . دێن
لێویان بەیەکەوە ئەنێن
بەبایی بووی لارێیەکان لێئەکەنن
ئای .. چ موژدەیێك ئەبەخشن
کە بەچرپە ..
شەوان لەگەڵ یەکتر ئەدوێن . !

٧ ی تشرین ١٩٧٩

---

(١) لەگۆڤاری نووسەری کورد ژمارە (٥) ی خولی دووەم ٢ سالی ١٩٧٩ بلاو کراوەتەوە .

# ورشه (١)

له ڕێگادا ..
له پێش ورشه بێداره‌كان
هه‌موو په‌رده‌و دیواره‌كان
شه‌رمه زارن ..
له ناویانا .
ئاواته سه‌وزو گه‌شه‌كان
دێنه به‌ر چاو
ڕه‌نگی زه‌ردو بازوو ئامێر
كێلگه‌ی دێم و شاره‌كان
بۆ یه‌كبوونی گشت ورشه‌كان
چاوه‌نوارن ..
چاوه‌نوران . !

١٠ ی ئاداری ١٩٧٩

---

(١) له گۆڤاری نووسه‌ری كورد ژماره (٢) ی ١٧٩ بلاوكراوه‌ته‌وه .

# کانی !. (١)

بائاوی جۆگەلەی ناودێ
زولاڵ و ساردو بەرچاو.بێ
باریێبواری ڕێگەی دووریش
تینووی ئاو.بێ . .
بەلاّم کە زانرا کانیەکە
«لاك» ی تیایە (٢)
تینوو نزیکی ناکەوێ
بەلێ رازی وشەش وایە . !!

١١ ع نیسانی ١٩٧٩

---

(١) لەنووسەری نوێ ژمارە (ه)ی ١٩٨٠ بلاّوکراوەتەوە
(٢) لاك : کەلاك

# بروسک !

هەندێ لەبروسک ئەترسن
ئەڵێن سووتانی لەدوایە
شریقەو دەنگی نەقۆڵایە
ئەی نازانن لە شەوی تار
ئەبێتە ڕابەری ڕێبوار
جا لەبەر ڕازی ئەم ئەرکەی
بروسکی ڕێ ..
منیش کە سووتانم شەوێ
بۆیێ ئیتر لە تیشکەکان
چەخماخەی بروسکم خۆش دەوێ .!

٢٠ی ئابی ١٩٧٩

# (دەبان)[1] و (پێنووس)!

لە ناو شایی جەژنی بەهار
دوو تووڕەی کار
پشتێن و گیرفانیان بڕی
فیتەی زوڕنایان نوساندو
پێستەی دەهۆڵیان هەڵدڕی
«دەبان» جەوهەری بەش کردو (۱)
مەستی دەرکرد..
پێنووس هەستی ئەرکی بەخشی و
تەمی لابرد ...!

۲۰ ی ئابی ۱۹۷۹

---

(۱): دەبان = مەبەست خەنجەری دەبانە

# کاروان کوژە !

ئەڵێن کاروان شەوان زۆر جار
لە دەشتی کاکی بە کاکی و
هەورازی هەزار بە هەزار
بەهۆی ئەستێرەی کاتشێوێن
هەڵەتەو سەرگەردان بوە
تامی گوژارکی چێشتوە
بەڵام ئەمرۆ بۆ ڕێی شەوان
بەهۆی یاقووتی زامەکان
ئەستێرەکان ..
دەبن بە سیوەیلی بەیان

١٩٧٦/٩/١٨

ڕێبوارەکان ..
دەڕۆن دەڕۆن
یەی بەدەشتو هەوراز دەبەن
کاروان کوژە ڕیسوا دەکەن..!

١٨ ی ئەیلوولی ١٩٧٩

# رازی ڕێبەندان

«لە مێرەم و لە ئۆغـەنا» [1]
کە ڕەشـەبا هەڵمەت دێنێ و
هەڵمەت دەبـا..
خشەی گەڵای دارو دەوەن
چی ئەنوێنێ..
جووکەی مەلی سـڕبووی بەفر
کە بۆ ماڵان پەنـا دێـنێ
چ مەبە سـتێك ئەدرکێنێ
منالێ چۆغەل هەڵدڕاو

---

(١) ناوی دوو هەفتەی زستانن

شر وەك داوەڵ .
لەبن دیواری بەر هەتاو
چ روانینێکی سروشن چاوەکانی
چ هەستێکە هەڵتوتانی
کە بێ ئارام چاوەنوارن
دژن بۆ وەنەوزی ڕێگا
شەتەکی پشدێنی کارن . !

٥ ی ئەیلووی ١٩٧٩

# نیفشکی شەو !

ئەڵێن شەو دەریای ئەندێشە ڕازی خۆشە
دڵدارەکان بە سروەی خۆش ئەیدوێنن
ژوانی زۆری لێ دێتە ڕوو
کانی هەنگوینی سەرخۆشە
بەڵێ بەڵام .. چاوتیژەکان
چۆن ئەیبینن :
وەك مەشکەیێکی گەورەیەو
یە نجەکانی ئاواتی ژین ئەیهەژێنن
بۆ قاوەڵتی کلۆڵەکان لەشەفەقدا
تۆیە نویشکی لێ دەردێنن .! (١)

٥ ی تشرینی ٢ ١٩٧٩

---

(١) نیغشك یا نویشك = کەرە

# بۆ نەورۆزی ١٩٧٧

نەورۆزەکەی گڕوگوڵو سەربەستی
بۆ کوردی کورد تۆ یادو بیرو هەستی
ئەی زاڵ بەسەر تۆف وەیشوومەی گەرد
تۆ ئامانجی تۆ ئاوات و مەبەستی .!!

# لووتکه !(١)

وشەی بەدو کینه بۆ پاك
وەك دەنگ و شاخ ..
ریسوایی کینه ئەنوێنی
لە ناتەواویش وشەی «ماك»(٢)
تەواوی پاك ئەسەلمێنێ
زێ پیس نابێ و بەرزی لووتکەش
سەر بەنزم دا ئەنوێنێ .. !

١٠ ی تشرینی دووەمی ١٩٨٠

---

(١) لە رۆژنامەی هاوکاری ٥٣٢ ی ١٩٨٠ بلاو کراوەتەوە .
(٢) ماك : میکرۆب = پیس

# (١) بڕوا..!

لەناو دەریا مەلە باسکەم لەکاردایە
شەپۆلەکان ئەبەزێنم
بڕوام بەکەنار بەهێزەو
ئەڕۆم تادوا وزەو تینم
لەئاسمانیش ئەستێرەی دوور
ئەدۆزمەوە ..
سەوزایی ناو دڵ و ناخ
حۆر ئەبینم ..
پەنجەم بە ڕستەی زەنگ ئەگاو
موژدەو ورشە ئەپەخشێنم .

١٩٧٧/١٠/٢

---

(١) لە ڕۆژنامەی هاوکاری (٥٣٢) ی ١٩٨٠ .
بڵاو کراوەتەوە .

# پرسیاری ساڵ![1]

ئەی منداڵانی چاو زیت و
بێ ڕەنگ و ڕوو..
ساڵی ئێوە تۆغری کرد بە بۆڵە بوڵ
لەگەڵ حەفتاو نۆ بارگەی خەم (٢)
وا ئاوا بوو..
لە ئاسۆدا پرسیارێکی کرد بەکڕی
گوتی کاکە پێم ناڵێی بۆ ؟
بۆ پێشوازیم منداڵێکی ئێوەم نەدی.!
گوتم ئەی بارگەکانت چین
گوتی ئەمانە نهێنین..
منیش بە خەنجەری دەبان
گشت بارگەکانیم هەڵدڕی
وەڵامی پرسیارم بڕی !!

٨ ى ١٤ ك ١٩٧٩

(١) لە گۆڤاری نووسەری نوێ ژمارە (٥) ١٩٨٠ بڵاوکرایەوە.
(٢) مەبەست ساڵی ١٩٧٩ ساڵی جیهانی منداڵان

# هەڵمات

هەندێ وەك پەلکە زێڕینەن
لە بەرگ و ڕوو ..
هەموو ساتێ وەك هەڵماتن
لەگۆڕان دا کە دێنە ڕوو
بۆ ڕابەری لەجێی بروسك
دەبنە پاڵوو ..
لە کەم .. پێ یان دەبڕێ نیشان
لە زۆر .. مۆرێك بۆ نێوچاوان !!

٢٠ی ٤ی ١٩٨٠

# گل و بیر ! [1]

تا دوێنێ «گل» ئەیگوت ئۆخەی
دەنگم بڕی .. !
بانگ و ئاوازم بەزاندو
ماتیم کرێ ..
بەڵام ئەمڕۆی پێتۆڵی و بیر
ئەمڕۆی نۆتەو چاوانی ژیر
کوولەکەی دنیایان شکاند . ! [2]
کۆتیان پساند ..
پەردەو ناو بڕیان هەڵدڕی
شالاوی «گل» یان هەڵبڕێ !!

١٥ ع شوباتی ١٩٨٠

(1) لە گۆڤاری نووسەری نوێ ژمارە (٥) ی ١٩٨٠ بڵاوکراوەتەوە.
(2) مەبەست بانگ دانی ناو کوولەکەیە . ! وانە یەکی فۆلکلۆریە

# خۆزگە (١)

خۆزگە بۆ دوێنێی کەم خەمی
جەنگ نادانی هەڵنا کێشم
لە ئاسووری تەمی ئەمڕۆش
لێ ورە نیم
گەرچی تووشی ناو گێژەڵی دەریای ...
سەرم لە ئاستی هەڵگوردەو
بەرامبەر سەهۆڵ و زریان
شانازی یە بزەی لێوم
خۆزگەی من بۆ بەیانی یە
بەڵێ بەیانی بەیانی ..
بۆ دلداران دوور نزیکەو

---

(١) لە رۆژنامەی هاوکاری ژمارە (٥٢٦)ی ئایاری ١٩٨٠
بلاو کراوەتەوە .

هەرشاد دەبم بە یارەکەم
منیش بڕۆم وشەکانم
ملوانکەو بازنی مروارین
لە نەورۆزو زەماوەندا
دەئاڵێنە ملو دەستی نازدارەکەم !

☆☆☆

١٠ی ئاداری ١٩٨٠

# ڕەنگی سروشت![1]

لە شوێنەواری ناو دێڕی
جووتەکانی قەد کێوو یاڵ
ئەزانن چیم هاتە بەرگوێ
زریکەو جاڕو گاڵەگاڵ
کاتێ لێیان ورد بوومەوە
بینیم ناو دەمی دێرەکان
وردە چڵی دارەکانن
وێنەیان بوەتە پیتەکان.!
کۆلکە دارێکی بچووکیش
بە وێنەی دەستێکی قوچاو
قیت وەستابوو لە نێوانیان..!!

١٥ی ئاداری ١٩٨٠

---

(١) لە ڕۆژنامەی هاوکاری ژمارە (٥٢٦) ی ١٩٨٠ بڵاوکراوەتەوە.

# کام سەرچاوەی سروشتی بیر

کام سەرچاوەی سرووشتی بیر
کامە بەهار ..
کام دیمەنی یەکجار دڵگیر
کامە نیگار
سەرچاوەی قووڵی سرووشتی
راستی دانانی هەڵبەستن
مایەی زاخاوو خۆراکی
بیرو سۆزی تەلی هەستن
کامەیانە .. ؟
ئایا .. دیمەنی بەیانی و ئێوارانە
ئاوازی بلبل و کەوە
یا تریفەی مانگەشەوە
لەقەد کێو شمشاڵی شوانە

یا مێگەلی ئاسک و بەرخ و
خەندەی ساوا و بزەی لێوی
نازدارانە ..
ئایا ورشەی پەرزیوینی
ئەستێرەی شەوی زستانە
یا دیمەنی زەماوەندو
رەشبەڵەک و چاوی جوانە ؟
ئەمانە گشت بەبێ گومان
سەرچاوەن بۆ ئاوازی گیان
سەرچاوەن بۆ چێژی ژیان
بەڵام لای من ..
رەنگ دزراوان
قووڵی چاوان

تێشووی نانە ڕەقی بێکار
زبری ناو لەپی زامدارو
خوێن تێزاوان ..
ئاوازی ناڵەی ناوسینە
پڕ زوخاوان
زنجی کڵۆڵ و زەبوونی
دەردەداران و داماوان
سەرچاوەی سرووشی بەرزن
هەژێنەری ..
هەموو خاوەن هەستی ئەرزن
دەریای نەوتی.
چرای ڕووناکی ئەم ژینە ن

بیری ڕێگەی ..
دوا ڕۆژی ورشەدارو
راستەقینەن .. !!

١٩٧٣/٧/٧

# چەند ورشەیێکی سەر ڕێگا ! (١)

پەروانەکان بۆ ڕووناکی
گیان بەخت ئەکەن
خێڵەکانی هەنگ بۆ ژیان
وانەی شانە پەخش دەکەن
چارەی دەردی سەخت دەکەن
بلبەکان بەیانیان
تا خۆر هەڵدێ هەر دەخوێنن
تەنانەت لە قەفەسیش دا
بۆ سەربەستی
دەچریکێنن هەتاکو هەن . !

---

(١) : لە گۆڤاری بەیان ژمارە (٤٤) ی ١٩٧٧
بڵاوکراوەتەوە .

ئەی ڕەنگ زەردان
ئەی بنیات نەرانی زەمین
خاوەنی ئازارو دەردان
ئێوەی مەزن ..
بابێوچان کێچ و زێرو ..
دەم بنێنە ناوخوێنی گەش
بەڵام ئەنجام ..
ئای کە ئەنجام موژدەیێکی بێ پایانە
بابزانن ڕەنگ دزەکان ..
درەنگ و زوو ئەم جیهانە
جلەوی فەرمان و کاری
گشت هەردو کێوو ڕوباری
موڵك و ناپۆی هەژارانە ..



# بریقەی چاو

ئەی چاوانی بە قووڵاچووی
منداڵ و لاوی زەحمەتکێش
لە سەرنجتان دەخوێنمەوە
سکاڵای زۆری دەردوئێش
بەڵام بریقەی چاوەکانتان
بروسکی هەوری بەهارە
زەنگ و دەنگێکی بەکارە
سپێدەی جەژنی چەوساوەو
سەرکەوتنی تێدادیارە..

٥ ى ٧ نیسانی ١٩٧٧

# شاڕێگا

وا لەوسەر شاڕێگەی ژیان
ئامانجی دوور ..
لێ ئەکەن بەڕێچکەکان
بە وشەو نەخشەو ڕەنگەکان
بەهێڵ تەلبەندی ...
ئەڵێ ئەم ڕێگەو ڕەنگانە
گەرچی ئەمڕۆ جیاجیانە
بەڵام هەموو .. پیادەو سوارەی
ئەم ڕێچکانە ..
درەنگ یازوو بۆ ئامانجێک
تێکەڵ شاڕێ ئەبنەوەو
هەموو هەر ئەچنەوە بانە ...!

☆ ☆ ☆

# داربەڕوو

لە کۆنەوە ڕەشەبای شووم

هێرش دێنێ ..

گەڵایەکان دەوەرێنێ

لقەکانی دارو دەوەن تێک دەشکێنێ

بەڵام هەرگیز نەیتوانیوەو ناشتوانێ

دار بەڕوێک لە ڕەگ و ڕیشە دەربێنێ!

☆ ☆ ☆

# ڕەگ

ڕەگەکانی دارو دەوەن

بە سەرچڵەکانیان دەڵێن

کاتێ بەفیز سەما دەکەن

هەرگیز لەخۆبایی مەبن

هێلانەی مەلان تێک مەدەن

وریابن وریا چڵەکان

ئێمە نەبین کەی ئێوە هەن .!



# شاعیرەکان

شاعیرەکان ..
ئەی تیشك و چاوو بیرەکان
بۆ.. ؟ کە تیری وشە ئەکشێ
بەرەو ئامانج ئەیگێڕنەوە ؟
بۆ.. ورشەی یاقووتەکانتان
لەناو تەمدا ئەشێرنەوە ؟
لە ڕێبازی بەرەو خۆردا
پەروا مەکەن ..
بیرو وشەو ئەندێشەتان
لە لاڕێدا گومرا مەکەن
لەڕێی ڕاستی چەوساوەکان
هەرچی بکەن هەرکەمە کەم
هاوڕێکانم هەرچی بکەن .. !

☆ ☆ ☆

# قەڵای بەفر

کاتێ ئەتڵەسی ڕەنگاوڕەنگ
دێتە بەرچاو .
چاوەکانم .. ئەبن بە یاقووت و فەنە
.... بەرگی پرسە ئەکەنەبەر
ئەبن بە جۆگەلەی خماو ...
بەڵام کاتێ زەنگی کاری مرۆڤی نوێ
دێتە بەرگوێ
لێرەو لەوێ
تخووبەکان ئەلەرزن و
ڕەنگەکانیان ئەچێتەوە
قەڵای بەفرو خەمی دێرین
خۆی ناگرێ و ئەتوێتەوە !

☆ ☆ ☆

# بانگ وزەنگی سێ وێنە

(١)

لەچاوانی پڕ لە ڕازی منالەکان
چی ئەبینم ..
لەقوپاوی ڕووی ژاکاوی ڕەنجبەرەکان
چی ئەبینم ..
وانەکانی کۆن و نوێی هەورازی ژێ
ئەخوێنمەوە
بۆ گەلێ پرسیاری ون بوو
وەڵامەکان ئەدۆزمەوە
لەتاریکی ورشەدارن
بە وشەی نوێ ..
چیەی کردار ئەدەن بە گوێ
ئەلێن وەنەوزی چاوی شەو
چارەی ڕاستی بەخوێ ئەکرێ ١٠

بۆ ساماناکی پەرتی ڕیزو شلی کەم
زەنگی ئەهەژێ ..
بروسکەی دوانزە ئەستێرەی
بەرزو نەمر پیمان ئەڵێ
چاوێلکەکان بسڕنەوە
ڕنۆکی ناو باغەکان ببڕنەوە
لەحەشارگەو جەنگەڵەکان
باش بگەڕێن ..
کەوا ئەمڕۆ لە گوێچکەدا لەڕێچ
زەنگەکانی ناو تەمی ڕێ
وا ئەهەژێن ..

٭٭٭

(٣)

خونچەی گوڵ و پەنجەرەکان
زنجی تاری ڕەنجبەرەکان
بۆ زنگ و موژدەی کەشتی و
بەندەرەکان
بۆ ئاوازو سۆزی بەیان
لە چاڕ دانن
چاوە ڕوانن
چاوەڕوانن

☆ ☆ ☆

١٨٧٤/٨/٥

# که یار ئەڵێ.. نا.. له (سابڵاخ)ی ژوان

له ڕێبەندان..
ئەندێشەی ئەرك[1]
ئەركی فرمان
بردمی بۆ «سابڵاخ»ی ژوان
ڕێگە زریان و سەهۆڵ بوو
یار، گیرۆدەی سەرماو سۆڵ بوو
لەناو بازنەی لوورەی گورگان
ڕەنگ زەرد بیدار
وەستا بوو هەل چاوەنوار
گەرجی تەمەنی زستانی
سی و پێنج ساڵ بوو..

---

(١) له گۆڤاری بەیان ژمارە (٧٥) ١٩٨١ بڵاوكراوەتەوە.

بەڵام ڕەشایی ناو قژو
سەری بەفرینی تاڵ تاڵ بوو
پێم گوت بەفر دەوری داوی
بەسیە وەستان و چاوەڕوان
تۆ چۆن ماوی
ڕەشەبا قژی زێڕینت لەبن دێنێ
بەفر پەنجەکانت دەبا
ژانی خاچی ناو دڵەکەت
ترس و سامناکی دەنوێنێ
بەسیە وەستان ..
تۆ چۆن ماوی
وەرە بڕۆین دووربین لەخەم

دووری سەرماو درندەکان
بەرگی ئاوریشمت لەبەرکەم
تارای رەنگینت لەسەرکەم
دەوەلامی..
بۆ دلی زارم ئارامی
بەوشەی.. نا..
یار کەوتە دوان
هەردو بەردو بەفری لەرزان
بەوشەی نا..
(ورە)ی بیرو دەماربار
بەقیژەی نا
لەناو کێوان گزنگ دەرکەوت
بزەی نەورۆزی کار باری..!!
نەورۆزی ١٩٨١

# بەری ئەگەرەکان چۆن دێنە ڕوو ! [1]

هەروەک چۆن دار بەڕووی چەسپاو
ڕەشەباکان دەبەزێنێ ..
هەروەک چۆن بۆ هەنگاوەکان

تریفەی دوور
خێڵی تاریکی دەشکێنێ
گەر بەڕاستی ئەی لاوەکان
ڕازی دیمەنی دەنگدارو
قووڵی چاوی هەژارەکان
توانی ئێوە بهەژێنێ
خەو لە چاوتان بتۆرێنێ
ئەوسا ئەتوانن لە دەریا
بەسەر شەپۆلەکان زاڵ بن

---

(1) لە ڕۆژنامەی هاوکاری ١٦٥٨٣ /٤/ ٨١ بڵاوکراوەتەوە.

بە کەناری سەوز شادبن
خاوەن ماڵ بن ..!



گەر توانیتان شکۆیەکان
بدەن بە تابلۆو بە بزمار
لە بەر چاوو لەناو دڵتان بچەقێنن
لەکاتی وەنەوزی ڕێگا
وەکو زەنگ بیانهەژێنن
ئەوسا جەنگەڵ و تەم دەبڕن
لەسەر لووتکە بێزارەکان
گۆڤەندان دادەمەزرێنن



ئەگەر ئیستتان
دڵی نەیاران خۆش نەکەن
لەوبەڕی ئەشکەنجەی ڕێگا
بزەی لێو فەرامۆش مەکەن
☆☆☆
ئەگەر ویستتان
رەسەنایەتی ون نەکەن
سەیری بنجی هێرۆ بکەن
☆☆☆
گەر توانیتان ..
رەگی کینەکان دەربێنن
تۆی ناکۆکی بسوتێنن
کەمەرەکان بشەلێنن
ئەبینن چۆن گورگ زێرو
لەبن دێنن ..

ئەبینن چۆن ..
شەختەی هەورازەکان دەبڕن
ئەبینن چۆن ..
بە بارانی پەڵەی راستی
گەنم
زەیتـون
گوڵ و بزە بەرهەم دێنن .. !

☆ ☆ ☆

١٠ی ئابی ١٩٨٠

# بروسکەیێک بۆ نەتەوەکانی ئێران و چوار چرای خوێنین "١"

ئەی چوار چرای نەوت خوێنین
ئەی خاوەن بەشێکی بەهەشت
لەگەڵ تۆداین ..
بۆ مەبەستێک دەمرین دەژین
با پتر پشکۆی زامەکان
هەڵاو داربن
با دەستەی چەپەڵی تاوان
هەر لەکاربن ..
کام وەیشوومەو تۆفەو زریان
توانی کێوێک بهەژێنێ ..!

---

(١) لە پاشکۆی رۆژنامەی عیراق ژمارە (٤١) ١٩٨١ وە
گۆڤاری بەیان ژمارە (٧٤) ی ١٩٨١ بڵاوکرایەوە

کام هێزی پەهلەوی و زەحاک

توانی گڵپەت دامرکێنێ

بە سیە ئیتر پیشدێنەکان بشەتێن

هەرگیز چیتر باشل نەبن

بە سیەو نەنگە

با شوورکەکان یەک جەیک بن

چڵ چڵ نەبن

هەڵمەتێ دەی

هەڵمەتێ دەی

کوردە تاکەی ۱۰

☆☆☆

زامەکان بوونە ئەستێرەو

ورشەکانیان سوێندو بەڵێن

لەگەڵ خوریەی دڵمان دڵتان
بۆ وەی لەگەڵ یەکتر دەدوێن
لە ڕێ بەندان چەخماخەتان
ئاسوودەیی دەپەخشێنێ
بۆ چوار لاوە بروسکەی دڵ
دەباو دێنێ ..
سنوورەکەی هێل بەفرین و
دیوار بەفر .. ؟
لە ئێمە زۆر دڵدارترە
بۆ تیشك و گڕ
چاوی قووڵی هیوایەکان
وەك بازنەن لەدەورەتان

ئەڵێن پەندو شکۆیەکان
بکەن بە زەنگی پێش کاروان
ئاگاداربن جەنگەڵ چڕە
خۆ بکەنە چاوی وەنەوزی رێگەتان
کورگەل هەلەو بەسیە ئیتر
پشدێنەکان بشەتێن
هەرگیز چیتر باشل نەبن
بەسیەو نەنگە باشوورکەکان
یەك چەیك بن
چڵ چڵ نەبن
هەڵمەتێ دەی
کوردە تاکەی ، !

٦ك٤ ١٩٨٠

# سۆراغ (1)

سۆزی دەروونو ئارەزووم ..
لەگەڵ سرووش کەوتنە تەکان
بۆ سۆراغی ڕازو هەواڵی ووشەکان
بە وێنەی هەنگو پەپوولە
گەرمیان کوێستان
گشت لا گەڕان
لە جەنگەڵو هەورازی ڕێ
لە ناو ئاوازی ڕێزەکان
لە شارو دێ
ئەی گەلێ کاریگەر بوو
ئەوەی سازی گەیشتە گوێ

---

(1) لە گۆڤاری (بەیان) ژمارە (39) ی 1977 بڵاوکرایە

هەندێ وشەی ناو پەڕاسوو

قووڵی چاو بوو --

ناڵەی گیانی (سی) خوراوبوو

☆☆☆

# گوتیان (٢)

گوتیان لە بەرزایی تەلار
لە شەقامی رووناکی شار
بینینی شت گەلێ جوانە
چێژی خۆشی دڵ و گیانە
بەڵام زۆربە گوتیان نوارین
بۆ ئەستێرەی ورشە زیوین
لە کۆڵانی تەنگ تاری
کونجەکانی کڵۆل نشین
گەلێ خۆش و جوانترە
لە ڕوانگەی کۆشکی ڕەنگین . !!



# (٣) گوتیان

گوتیان دەشت و کێو یاراوە
لە کۆساران ئەمڕۆ کۆتر
بۆ وەی لە سەرچڵ وەستاوە
لەبن داری گوێزو خورما
ئاوازی لاوك و عەتابە
بۆژینی نوی تێکەڵاوە

☆ ☆ ☆

## (٤) - گوتیان

گوتیان پار بوو هەموو زەوی
ساتێك بۆ ئافرەت نەسرەوی
بانگی رادیۆو رۆژنامەکان
ئاوازی ماف یەکسانی
زۆر لێ درا ..
بێ ژمار پۆستەرو تابلۆ هەڵواسرا
بەڵام لای ئێمە خوێندەوار
بۆ ماف وەستاون بە دووبار
لە دەرەوەی ماڵ لە یانە
ئەڵێن ئافرەت وەك پیاوبێ
خاوەنی مافی تەواوبێ

بەڵام کەچوونەماڵەوە
ئەچنەوە ناو بیری وشك
بۆ هاوسەرو دایكو خوشك
بۆماف ئەبن بە دوو یشك
بەڵێ سەیرە - بەزەم وایە
ئای لەم بانو دوو هەوایە !

٭ ٭ ٭

## (٥) گوتیان

گوتیان ئەمرۆ خۆری نوێ
گەلێ پتر لە ساڵی پار
هەڕەس ئەهێنێ بە بەفر
بەرەو ڕوبار...
هەورو تەمی ئاسۆی بەیان
چۆڵ ئەکەن بۆ گزنگ مەیان
ڕووناکی ئەکشێ بۆ زنج و
بۆ بیری تار..
بلبل مەستە بە کروک و
هێرۆی بەهار ...

بەڵام دژی نەیاری خۆر

لە دژی داو .. !

گەلێ بەسۆز ئەدرکێنێ

وشەی بێداری جاروبار .!

☆ ☆ ☆

# (٦١) جۆخینەکان

بەڵام وشەی دوا وەڵام
ئەمەی ڕاگەیاند بێ ئارام ..
گوتی بۆ ئەوەی هەتاومان
بەتین‌تر بێ ..
بۆ ئەوەی دیمەنی گوڵشەن
ڕەنگین‌تر بێ ..
بۆ ئەوەی پشدێنی یەکبوون
بەبێ خەش بێ ..
بۆ ئەوەی ڕووی سیس و زەردباو
سوورو گەش بێ ..
جۆخینەکان لەوەتی هەن
چاوەڕوانی بێژنگێکی
کون وردن دەکەن ..

نەورۆزی ١٩٧٦

# بۆ کۆرڤالان

بەڵێ ئەمڕۆ لەناو هەوری سانتیاغو
رەنگی گوڵو خوێن دیارە
دیواری بەرز زیندانی قووڵ
مایەی پیلانی دۆلارە
بەڵام لە دەریای ناخۆشی
کە گیان بادەی مەرگ ئەنۆشی
لەجێی نالــە ..
لەسەر شانۆی مەرگەسـاتێ
ئەم مەیدانە
وەڵام بزەی نەبەردانـە . ١

نزیک و دوور
زەنگ و جاڕی دلێرەکان
ئەبڕن سنوور
پەردەی تەمەکان دائەدڕن
زنجیرەکان هەڵ ئەبڕن
بروسکەی بڕواو نەبەردی
ئەپەخشێنن ..
تەختی تاوان ئەلەرزێنن
چ زەنگێکە چ دەنگێکە
رازی سەرکەوتن مانە
بانگی « شیلی » قارەمانە
وشەی بڕوای پۆلایینی کۆڤالانە .

٩ ی تشرینی ١ ١٩٧٤

# ١ رازی سێ باڵداری دڵدار

## بلبل (١)

بلبلی جوان ..
شەوان بێ ئارام بێ وچان
چاوەڕوانە بۆ ئاڵ بوونی
ئاسۆی بەیان
تا بەخشکا بەجۆش و سۆز
رازی پەنهان
ئاوازی رووناکی ژیان .. !

---

(١) لە گۆڤاری رۆشنبیری نوێ (٥٥-٥٦) ١٩٧٦ بڵاوکراوەتەوە .

# (٢) هەنگ

هەنگی دڵدار
بۆ دیدەنی و راموسانی
دەمی گوڵانی لالەزار
لە هاتوچوونی بێژمار
نابێ بێزار
دەرمانی حەوت دەرد بۆ مرۆڤ
ئەگرێتەوە
هەردەم لەرەنجی بێ بەشەو
هەمان رێگا ئەگرێتەوە . !

# پەروانە (٣)

ە شەوە زەنگ
ە دوور پەروانەی ڕەنگاو ڕەنگ
کە تریسکێک بەدی ئەکات
بۆی دێ بەسۆز
بێ هەست و دەنگ
خێرا خێرا وەکو شەیدا
باڵی ناسک لەچرا ئەدا
ئەسووتێ و ئەکەوێتە خوار
پێشێل ئەکرێ و هەرد ئەنەخشێ
جێ دێڵێ وانەو یادگار.. !

١٩٧٤/٩/١٠

---

# بۆ نەورۆزی ١٩٧٦

هەموو ساتێ
هەموو کاتێ
وشە دڵدارەکانی من
وەکو گزنگ وەکو هەتاو
پەخش ئەبن ..
لەگەڵ کاروانی رۆژی نوێ
ئەبڕن هەورازی سەختی ڕێ
لە دەریاو هەوری رەش ئەدەن
حەشارگەی تار ڕیسوا دەکەن
بۆ کونج و زنجی داماوان
ئەبن بە هۆ ..
رەنگ و بزە ئەبەخشن بۆ
کوڵم و لێوی زەردو بێ بۆ

[illegible]
[illegible]
[illegible]
وه‌رزه‌كانا ئه‌خولێنه‌وه‌ ..
بۆ بڵێسه‌و سۆزی نه‌ورۆز
دنیای (نۆته‌)ن نابڕێنه‌وه‌
ئه‌چریكێنن ..
ماكی ژانی ده‌ردی هه‌ژار
له‌بن دێنن ..
سازی نسازی ناو جه‌نگه‌ڵ
ئه‌خنكێنن
وشه‌كانی من نیشانچین
بۆ ئامانجی به‌رزو دووری مرۆڤ و ژین

لە ڕێگادا جەنگاوەرن
بازنەی ئاسۆیەکان دەبڕن
بەدوای بزەی ڕاستی لێوی
لات و کڵۆڵەکان وێڵن
گەر بشمرن ..
ناسنامەکەیان جێ دێڵن..!

☆ ☆ ☆

وشەکانم دژی تانەن
تانەی چاوان.. !
(وەرە) ن بۆ مات و دوودڵ و
دەنگ نوساوان..
ڕیسن بۆ گوریسەکانی
یەکبوونی ڕێز ..

ئاون بۆ خونچەو شکۆفەی
گوڵی پاییز
گرو بڵێسەن بۆ نەورۆز
تا ئەنجام بۆ ئاواتی هۆز
ئەکشێن بۆ ناو کێڵگەکان و
کارگەی ووڵات
ئەکشێن بۆ ناو ڕیزەکانی
ڕێگەی ئاوات
لە پێش کاروانی ڕۆژی نوێ
ئەسوتێن ئەڕۆن ناوەستن
لە ڕێی خەبات و ژیانا
زاڵن بەسەر شەوو نوستن

# هەندێ ڕازو نیازو ئەرک

(١)

لەناو تابلۆو سازەکانا
لەسەر لێوی ئاسۆی ئاڵو
بنج و ناخی ڕازەکانا
بۆ ئەرکی ڕۆژێ چی ئەبینم
چی دێتە گوێ..
چ ڕازێکە سنوور ئەبڕێ
ڕێگەی هەورازو دوور ئەبڕێ
لە « بۆتانا » ..
لە سەری بەرزی « سیانا » (١)
دێتە وەڵام

(١) ناوی کێوێکە لە ناوچەی بادینان

ئەم رازە گیانی (خانی) یە
ئەمڕۆ ئەدوێ
چیەی کردار ئەدا بەگوێ
زمانی حاڵی هەرئەڵێ
هۆزانڤانان هۆزانڤانان
بۆ ئەرکی رۆژگەیشتنە کوێ؟!

☆☆☆

(١)

دڵدارەکان..
لەبەر ئەڤینی پەروانەو
شەم و هەنگ و گوڵاڵەکان
لەبەر سکاڵای چاوانی کڵۆڵەکان
بەفرو سەهۆڵ چەندە زۆربن

کە شارێکەو چارەن تاسەر
بۆ کلۆڵ و داماوەکان
ئەی لاوەکان
ئەی لاوەکان !!

* * *

(٥)

ئەی زەنگیەکە خۆشم دەوێی
وەك ڕەنجبەرانی کوردستان
خۆشم ئەوێی
بریقەی ڕەشی نێو چاوانت
گزنگی لێ دەرئەکەوێ
هەموو یەکین ..
هەروەکو گزنگەکان و چاوگی خۆر
هەموو یەکین ..
هەموو هانایین

له هه‌رشوێنێك مرۆڤ جاڕی
خه‌می هه‌بێ ..
پشت و هانایین
هانایین له‌گه‌ڵ ئێوه‌ ئه‌ژین
یه‌كین دژی خاوه‌ن (نیترۆن) (١)
هه‌وراز ئه‌بڕین و نابه‌زین ..
خۆشم ئه‌وێ
وه‌ك ئه‌و نه‌به‌ردانه‌ی تاسه‌ر
كۆڵیان نه‌دا ..
وه‌كو بڕوای پۆلاینی
(مارتن لوثه‌رو) و نیرۆدا
(٦)
ده‌نگی نیهان ..
پرسیاری كرد له‌وشه‌كان

(١) مه‌به‌ست بۆمبای نیترۆن داگیركه‌رانه

لەناو گێژەی گەرداوو تەم ومژدا
کامتان ڕابەرن بۆ ژیان ؟
سەدان وشە هاتنە وەڵام
یەکیان گوتی :
من سەربەستیم
لە هەمووتان لە پێشترم
ئەوی تر گوتی من ئاشتیم
هەر منم ..
سێیەم گوتی بەختیاریم
لابەری ئاخی هەژاریم
چوارەم گوتی من ڕووناکیم
ڕابەری ڕێی خۆشی و چاکیم
گەلێکی تروشەی بەباڵ
هاتنە پێشەوە بە فیشاڵ

وەڵام تەواو بوو. لێ ئەنجام
بەڵام خاوەن وشەی نیهـان
لە دوورەوە هـاتە وەڵام
گوتی هیچتان نەتانزانی
داد لە دەستتان

ئێوە خەوتوون

ئێوە خەوتوون

هەموو گوتیان چۆن وائەڵێی
چی تر ماوە ؟
گوتی یەکبوون
تەنها یەکبوون
بەڵێ یەکبوون .. !

---

لە ٢١/٧/١٩٧٨ لە میهرەجانی شیعری دهۆك
ئەم شیعرەم پێشکەش کرد

# ڕەنگی وێنەکان وئەرک

بە ڕێزەکان ..

لە ڕێگەوبان

ئەبینم گەلێ بەرامبەر شانۆیەکان

ڕوانگەی سەرنجیان لێڵ دەکەن

یافێڵ دەکەن

یا لە ڕاستی خۆ گێل دەکەن

لەناو تامەکان بە تەنها

چێژ لە شیرینی وەردەگرن

هەروا دەژین

هەروا دەکڕن

---

بەڵام لای من بەرێزەکان
شیرینە تاڵاوی دەرمان
بۆ زامەکان ..
بۆیە لە سوودی تایبەتی لەتیکەی چەور
لەبەرگی جوان
دەسڵەمێمەوە .بێ وچان .!
بۆیە هەردەم وشەکانم
لەناو قەسرو شوێنی نەرما
لەجێی فێنك لەجێی گەرما
بەبێ ئۆقرەن دێن و دەچن
لەگەڵ گزنگ تریفەو
بریقەی چاوی رەنجبەران
بۆ هەموولا پەخش دەبن

بەرەو ورشەیێك ڕێ دەبڕن
ئەسوتێن و خۆشی دەکرن
گێتی دەهەژێنن و دەڵێن
دەیەك بۆ ئەی دڵدارەکان
ئەی خاوەنی ئازارەکان

☆ ☆ ☆

کاتێ ڤینەکان دەکوڵێن
دژی ئەهریمەنی جەنگەڵ
دژی نەیار..
کاتێ چاوی چەوساوەکان
دەبن بە گڕو بە پشکۆ

بۆ پەنجەو داوی ستەمکار
کاتێ هاوارو ژانەکان
کۆدەبنەوە ..
هەردو دارو کەژو چیا
ئەنانەت ڕوبارو دەریا
وەکو بۆمبا ئەتەقنەوە

☆☆☆

ئاسوودەبن
لەناو گێژەی ژیانی پڕناسوورا
لەناو وەیشوومەو بەفرو تۆف
لەهەورازی ڕێگەی دوورا
هەڵمەت بەرن و ئاسۆدەبن

کاروانی ڕێی هات و نەهات
ئەگاتە جێ ..
ئاوی ڕووبار لەیەك شوێن بێ
لە چرکەیێك هی کۆن دەرواو
هی نوێ دێ .. !
لە کاتێ بەستی ئەتگرێ
لە کاتێ کۆسپی سەرەڕێ
لە سەر دڵ ئەبێتە گرێ
هەڵەت بەرەو ئاسوودەیە
لە ژێر دەواری ڕەشی خەم .
کە هیوای فرمان دەمرێ
ئاسوودەبە
بزەی لێوەکانت زاڵکە

بەسەر دەریای ناسوورو خەم
بیرو تینت (ورە) دارکە
ڕوو بەڕووی ئازارو ستەم
جەرگی شەپۆلەکان ببڕەو
تەلی ئومێدت نەبڕێ
ڕەگ و پەردەی کۆن و ڕزیو
هەر دەبڕێ و هەر دەدڕێ

☆ ☆ ☆

ئەرکی ئەمڕۆ ئەڵێ چۆن بین
گەر چاوانی چاوەڕوانی
پڕکەین لە بڕواو لە ئەوین

گەر ڕەگی کینەکان هەموو
بکەین بە سووتووی باخی ژین
گەر ئاوازە بەسۆزەکان
هەموو یەك بوون و هاتنە ڕوو
ئەوسا ئەبینین زوو بەزوو
لەناو ئەم خۆڵ قوڕەدا
چ ئاوەدانی و بەرزێك
چ ئاواتێکی بێ هاوتا
ها .. پەیدا بوو ..

☆☆☆

من دڵنیام ..

بە ئەنجامی ئەو ورشەیەی
چاوەکانم پێی کردەوە
بەو گزنگ و رووناکی یەی
گرەوی لەخۆر بردەوە
من دڵنیام ..
هەموو چاوە بێدارەکان
چاوی منن ..
ئاوازی لێو بەبارەکان
دەنگی منن
رەنگی پەڕی گوڵاڵەکان
رەنگی منن
بۆ ئاواتی بێ رەنگەکان

هەنگاو ئەنێم بۆ وچانم
بەرەو ورشەی لووتکەی ژیان
هەتا ماوم لە سووتانم
بۆ نەمانی چقڵ و تەمی ئەو بەهەشتەی
کە شیرین ترە لە گیانم .!

☆ ☆ ☆

٣ی ئاداری ١٩٧٧

---

ئەم شیعرەم لە میهرەجانی شیعری
کوردی لە ١٩٧٧/٣/٢٧ لە
لە هەولێر پێشکەش کرد

# پێرست

لاپه ڕه

الجمهورية العراقية
وزارة الثقافة والاعلام
دار الثقافة والنشر الكردية
التسلسل ٧٤

# شَجَرَةُ البَلّوط

شعر

مدحت بيخەو

السعر ٥٠٠ فلساً

دار الحرية للطباعة ـ بغداد
١٩٨٣/٣/٣٠/١٠٠/٤٠٠٠